# قَصِيدَةُ الحَائِيَّةِ

لِابْنِ أَبِي دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيِّ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَىٰ

المُتَوَفّٰى سَنَة

(٢٣٠-٣١٧ هـ)

"وەرگێڕانی : كتاب السلف"

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

خاوەنی ئەم هۆنراوەیە : عبد الله بن سليمان بن الأشعث الأزدي السجستاني يە .

کونیەکەی : أبو بكر .

لە (**٢٣٠** هـ) لەدایک بووە، وە لە (**٣١٦** هـ) وەفاتی کردووە .

## ١ - تَمَسَّكْ بحَبْلِ اللهِ وَاتَّبِعِ الهُدَى
## وَلَا تَكُ بِدْعِيًّا لَعلَّكَ تُفْلِحُ



دەست بگرە بە پەتی الله تعالی وە شوێنکەوتەی هیدایەت بە

وە شت دامەهێنە بەڵکو سەرفراز بیت



که دەڵێت ﴿بِحَبْلِ اللهِ﴾ واتە : دەست گرتن بە قورئانی کریم، وەک الله تعالی دەفەرمووێت : ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ﴾ [آل عمران - ١٠٣] .

وە کە دەڵێت شتی بیدعە دامەهێنە و شوێنی بیدعە مەکەوە، هەموو بیدعەیەک دەگرێتەوە، ئەوەی لە دین دەرت دەکات، وە ئەوەشی کە لە دین دەرتناکات بەڵام لە بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعەت دەرت ئەکات .

## ٢ - وَدِنْ بِكِتَابِ اللهِ وَالسُّنَنِ الَّتِي | أَتَتْ عَنْ رَسُولِ اللهِ تَنْجُو وَتَرْبَحُ



بەوشێوەیە دینداری بکە کە لە کتابی اللە - قورئان - و سوننەتی

رسول اللە ﷺ هاتووە بۆ ئەوەی ڕزگارت بێت و قازانج بکەیت



لێرەدا ئیمام مەبەستی ئەوەیە کەوا بەوشێوازە اللە بپەرستە کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، قورئانی جیانەکردۆتەوە لە سوننەت، کە ئەمەش ڕەددە بۆ قورئانییەکان کە دەڵێن تەنیا شوێنی قورئان دەکەوین، سوننەتیان پشتگوێ خستووە .

سوننەت بەشی دووەمی وەحیە لە دوای قورئان وەک اللە تعالى دەفەرموێت : ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤)﴾ [النَّجم] .

## ٣ - وَقُلْ : غيرُ مَخْلُوقٍ كَلَامُ مَلِيكِنَا | بِذَلِكَ دَانَ الْأَتْقِيَاءُ وَأَفْصَحُوا |



وه بڵێ كەوا كەلامی الله غەير مخلوقە

بەوشێوازە ئەهلی تەقوا - باسیان کردووە - و ڕوونیان کردووەتەوە .



لێرەدا باسی سیفەتی کەلام بۆ الله تعالى دەکات، وەک الله تعالى دەفەرموویت : ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ [سُورَةُ النِّسَاء : ١٦٤] .

کە دەڵێت **(مَلِيكِنَا)** مەبەستی الله یە کە خاوەنی هەموو شتێکە، هەروەها باسی ڕوونی عەقیدەی سەلەف دەکات لە بابەتی جێگیرکردنی سیفەتی کەلام بۆ الله تعالى .

## ٤ - وَلَا تَكُ فِي القُرْآنِ بِالوَقْفِ قَائِلًا | كَمَا قَالَ أَتْبَاعٌ لِجَهمٍ وَأسْجَحُوا



وه لەوانە مەبە کە دەربارەی قورئان دەوەستن

هەروەکو شوێنکەتووانی جەهم دەیڵێن وە بەباشی دەزانن



ئیمام باسی ئەوانە دەکات کە دەوەستن لە قورئان، واتە نە دەڵێن مەخلوقە، نە دەڵێن غەیر مخلوقە، کە ئەمە عەقیدەی جەهمیەکانە و دەوەستن لە قورئان، ئیمامەکەیان جەهم بن صفوانی ابو محرص سمرقندی یە .

## ٥ - وَلَا تَقُلِ القُرآنُ خَلْقٌ قَرَأْتُهُ | فَإِنَّ كَلَامَ اللهِ باللَّفْظِ يُوضَحُ



وه مه‌ڵێ قورئان به خوێندنه‌وه‌ی من مه‌خلوقه

چونكه به‌ڕاستی كه‌لامی الله به له‌فز ده‌رئه‌بڕدرێت و ڕوون ئه‌كرێته‌وه



مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه كه وا نابێ بڵێی خوێندنه‌وه‌مان بۆ قورئان مه‌خلوقه، هه‌روه‌ها الله هه‌ركات بیه‌وێت قسه ده‌كات جیایه له قسه‌كردنی مه‌خلوقه‌كانی .

## ٦ - وَقُلْ يَتَجَلَّى اللهُ لِلْخَلْقِ جَهْرَةً | كَمَا البَدْرُ لَا يَخْفَى وَرَبُّكَ أَوضَحُ



وە بڵێ الله تعالی خۆی نیشانی مەخلوقەکان بە ئاشکرا و بێ پەردە

هەروەکو مانگی چواردە، شاراوە نییە وە پەروەردەگارت لەوە ڕوونتر دەیبینی



لێرەدا باس لە بینینی الله تعالی دەکات کە بێ پەردە و بە ئاشکرایی خۆی نیشانی بەندەکانی دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا هەروەکو الله تعالی دەفەرمووێت : ﴿**وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ** (٢٢) **إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ** (٢٣)﴾ [**القيامة**] .

وە رسول الله ﷺ دەفەرموێت : (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كما تَرَوْنَ هذا القَمَرَ، لا تُضَامُّونَ في رُؤْيَتِهِ) .

واتە : ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەکو چۆن ئەو مانگە دەبینن، وە هیچ نارەحەتیەک نابینن لە بینینی .

هەروەها بینینی الله تعالی زۆر ڕوونترە لە بینینی مانگی چواردە .

## ٧ - وَلَيسَ بِمَولُودٍ وَلَيسَ بِوَالِدٍ | وَلَيسَ لَهُ شِبْهٌ تَعَالَى المُسَبَّحُ



الله تعالى نه لەدایک بووە، وە نە باوکە

وە نە هاوشێوەی هەیە پاک و بێگەردی بۆ الله تعالی .



هەروەك الله تعالی دەفەرموویت : ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ [سُورَةُ الإِخلَاص] .

کە الله دوورە لە هەموو هاوبەشێک کە کافران بۆی دادەنێن، والعياذ بالله .

وە الله عز وجل پاک و بێگەردە لەوەی کە لە دروستکراوەکانی بچێت, وەك دەفەرمویت : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى : ١١] .

## ٨ - وَقَدْ يُنْكِرُ الجَهْمِيُّ هَذَا وَعِنْدَنَا | بِمِصْدَاقِ مَا قُلْنَا حَدِيثٌ مُصَرِّحُ



وه جەهمیەکان ئینکاری ئەوە دەکەن - واتە ئینکاری بینینی الله دەکەن - .

وە لەلای ئێمە بۆ بەڕاست خستنەوەی ئەوەی کە ووتمان فەرموودەیەکی ڕوون و ڕاشکاو هەیە .



لێرەدا مەبەست پێی ئەوانەن کە ئینکاری بینینی الله تعالى دەکەن، وەک جەهمیەکان و ئەشعەریەکان و ماتوریدیەکان و موعتەزیلە . . . هتد، بەهۆی ئەم ئینکاری و پەکخستەیانەوە لە بازنەی ئیسلام دەرچوون .

چونکە بینینی الله تعالى لە ڕۆژی قیامەتدا جێگیر کراوە بە موحکەمی قورئان و حەدیسی صحیح وەک باسمان کرد لە بەیتی پێشوو .

## ٩ - رَوَاهُ جَرِيرٌ عَنْ مَقَالِ مُحَمَّدٍ | فَقُلْ مِثْلَ مَا قَدْ قَالَ فِي ذَاكَ تَنْجَحُ



هەروەکو ڕیوایەت کراوە لە جریر لە وتەی محمد ﷺ

هەر ئەوە بڵێ کە دەربارەی بینینی الله وتراوە ئەوا سەرفراز دەبیت



جَرِير مەبەست پێی جرير بن عبد الله الأحمسي رضي الله عنه کە لە (**٥١** ﻫ) وەفاتی کردووە، وە وتراوە لە (**٥٤** ﻫ) کە ئەو حەدیسەی بینینی الله تعالى لە رسول الله ﷺ ڕیوایەت کردووە : (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كما تَرَوْنَ هذا القَمَرَ، لا تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ).

## ١٠ - وَقَدْ يُنْكِرُ الجَهْمِيُّ أَيْضًا يَمِينَهُ | وَكِلْتَا يَدَيهِ بِالفَوَاضِلِ تَنفَحُ



جەهمیەکان بەهەمان شێوە ئینکاری دەستی ڕاستی الله دەکەن

وە بە هەردوو دەستی بە فەزڵی خۆی دەبەخشێت .



جەهمیەکان و موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتوریدیەکان ئینکاری ئەوە دەکەن کە الله تعالی دەستی ڕاستی هەیە، دەست لە سیفاتی الله تعالی یە، وەک الله تعالی دەفەرمووێت : ﴿**وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ**﴾ **[الزمر : ٦٧]** .

یان رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (وَكِلتا يَدَى يَمين) **رواه مسلم** .

واتە : هەردوو دەستی الله تعالی ڕاستن.

وە الله تعالی دەفەرمووێت : ﴿**بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ**﴾ **[المائدة : ٦٤]**، وە دەفەرمووێت : ﴿**لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ**﴾ **[ص : ٧٥]** .

لەم ئایەتانەدا سیفەتی دەست بۆ الله تعالى جێگیر دەکرێت، بەڵام موعتەزیلە و جەهمی و ئەشعەری و ماتوریدیەکان سیفەتی دەست تەحریف دەکەن بۆ نیعمەت و قودرەت .

# ١١ - وَقُلْ يَنْزِلُ الجَبَّارُ فِي كُلِّ لَيلَةٍ | بِلَا كَيفَ جَلَّ الوَاحِدُ المُتَمَدِّحُ



وه بڵێ كه الله تعالى هەموو شەوێك دادەبەزێ - بۆ ئاسمانی دونیا -

بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەكەی بزانین، گەورەیی بۆ الله ی تاك و تەنهای ستایشكراو .



موعتەزیله و جەهمی و ئەشعەری و ماتوریدیه پەكخەرە زەندیقەكان سیفەتی دابەزینی الله عزَّوَجَل پەكئەخەن بەهۆی ئەو عەقیدە كەلامیە كوفریەی هەیانە .

## ١٢ - إِلَى طَبَقِ الدُّنْيَا يَمُنُّ بِفَضْلِهِ | فَتُفْرَجُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَتُفْتَحُ



- دادەبەزێت - بۆ چینی ئاسمانی دونیا بەفەزڵی خۆی منەت دەکا - بەسەر بەندەکانی -

دەرگاکانی ئاسمان لادەبرێت و دەکرێتەوە .



دابەزین یەکێکە لە سیفاتەکانی الله تعالی، دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، هەرکات بیەوێت و بەوشێوەیەی کە ویستی لێیەتی، نابێ لە چۆنیەتی دابەزینی الله بپرسین، وە نابێت وەکو پەکخەرەکان سیفەتەکە پەکبخەین .

## ١٣ - يَقُولُ أَلَا مُسْتَغْفِرٌ يَلْقَ غَافِرًا | وَمُسْتَمْنِحٌ خَيْرًا وَرِزْقًا فَيُمْنَحُ |



دەفەرموێت ئایا کەسێک نییە داوای لێخۆشبوون بکات تا بگات بە لێخۆشبوویەک؟

وە کەسێک بیەوێت لە خێر و چاک و ڕزقێک نزیک ببێتەوە جا لێی نزیک بکرێتەوە .

## ١٤ - رَوَى ذَاكَ قَوْمٌ لَا يُرَدُّ حَدِيثُهُمْ | أَلَا خَابَ قَومٌ كَذَّبُوهُمْ وَقُبِّحُوا



ئەوە ڕیوایەت کراوە لە کۆمەڵەیەک کە ڕەتناکرێتەوە حەدیسەکانیان

ئەو کۆمەڵەیە خەسارەتمەند بوون کە بەدرۆیان خستنەوە و ڕسوا بوون



مەبەستی دابەزینی الله تعالى یە کە لە کەسانی ڕاستگۆوە گێڕدراوەتەوە، وە تەنیا ئەوانە خەسارەتمەند بوون کە ڕەخنەیان لەو حەدیسە گرتووە، وەک موعتەزیلە و ئەشاعیرە و جەهمی و ماتوریدیەکان و موفەویضەکان .

## ١٥ - وَقُلْ إِنَّ خَيرَ النَّاسِ بَعْدَ مُحَمَّدٍ | وَزِيرَاهُ قِدْمًا ثُمَّ عُثْمَانُ الَارْجَحُ



وه بڵێ كه وا باشترين كەس له دواى محمد ﷺ

دوو وەزيره پێشخراوەكەيەتى، پاشان ئەوان عثمان ه رضي الله عنه پێشخراوه



دوو وەزيرەكە مەبەستى أبوبكر صديق و عمره رضي الله عنهما كه پێشخراون، پاشان بۆچوون ڕاجح و درووست ئەوەيە كه لەدواى ئەو دووانه عثمان دێت رضي الله عنه .

## ١٦ - وَرَابِعُهُمْ خَيرُ البَريَّةِ بَعْدَهُمْ | عَليٌّ حَلِيفُ الخَيرِ بِالخَيرِ مُنْجِحُ



وه چوارەمیان باشترین درووستکراوە لەدوای ئەوانەوە

علي یە رضي الله عنه کە پەیوەست بووە بە خێرەوە هەر بە چاکەش سەرکەوتوو بووە .



ئیجماعی ئەهلی سوننە و جەماعە جێگیر بووە لەسەر ئەوەی ڕیزبەندی باشترین هاوەڵان بەم شێوەیەی : أبو بكر الصديق، پاشان عمر بن الخطاب، پاشان عثمان بن عفان، پاشان علي بن أبي طالب، رضي الله عنهم

١٧ - وَإِنَّهُمُ للرَّهْطُ لَا رَيْبَ فِيهِمُ | عَلَى نُجُبِ الفِرْدَوسِ بِالنُّورِ تَسْرَحُ |



ئەمانە کۆمەڵەیەکن - چوار خەلیفەکە - هیچ گومانی تێدا نییە،

کەوا - دەخرێنە - فیردەوسی پاک و جوانەوە بۆ هەمیشە - نیعمەتەکانی بەهەشتیان - بۆیان ئاسان دەکرێ .

## ١٨ - سَعِيدٌ وَسَعْدٌ وَابْنُ عَوْفٍ وَطَلْحَةٌ | وَعَامِرُ فِهْرٍ وَالزُّبَيرُ المُمَدَّحُ



سعيد و سعد و ابن عوف و طلحة

وه عامر له بەنى فهر وه زبيرى ستايشكراو



(سَعِيد) مەبەست پێ أبو الأعور سعيد بن زيد القرشي العدوي رضي الله عنه.

(وسعد) مەبەستى أبو إسحاق سعد بن ابى وقاص القرشي رضي الله عنه.

(ابن عوف) كه مەبەست أبو محمد أبو عبدالرحمن بن عوف القرشى الزهرى رضي الله عنه .

(طَلْحَة) كه مەبەست أبو محمد طَلْحَة بن عبدالله القرشي الزهري رضي الله عنه .

وه ( عَامِرُ) كه مه‌به‌ستی أبو عبيدة عامر بن عبيد الله بن الجراح الهذلي رضي الله عنه.

(الزبير) مه‌به‌ست پێی أبو عبد الله الزبير بن العوام القرشي الأسدي رضي الله عنه .

ئه‌مانه هه‌موویان مه‌دح كراون رضي الله تعالى عنهم أجمعين

## ١٩ - وَقُلْ خَيرَ قَولٍ فِي الصَّحَابَةِ كُلِّهِمْ | وَلَا تَكُ طَعَّانًا تَعِيبُ وَتَجْرَحُ



وە باشترین قسە بکە دەربارەی هەموو هاوەڵان

وە تانەیان لێمەدە و عەیبیان لێمەگرە و ئازاریان مەدە



دەربارەی هەموو هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەبێت باشترین قسە بکرێت، چونکە ئەوانە هاوەڵی پێغەمبەر بوون ﷺ، دەبێت چاکەکانیان باس بکەیت، ڕەحمەتیان بۆ بنێریت، وە دوعایان بۆ بکەیت، وە دەست هەڵگریت لەو ناکۆکیەی کە ڕوویداوە لەنێوانیان، چونکە ئەوان نزیکترین کەس بوون لە رسول الله وە ﷺ، وەک الله تعالی دەربارەیان دەفەرمووێت : ﴿**وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ**﴾ **[التوبة : ١٠٠]** .

وه دەفەرموێت : ﴿**وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى**﴾ [**النساء : ٩٥**]، وه لێرەدا الله مەدحی هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەكات، وه لە صحیحی البخاري و مسلم دا كە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (خيرُ الناس قرني) .

واته : باشترینی خەڵك ئەوانەی سەردەمی منن.

كەواته زۆر گەورەیە تۆ قسەیان لەسەربكەیت بەخراپە، بۆیە هەرگیز نابێت تانە و تەشەریان لێبدەیت یا خود غەیبەتیان بكەیت .

## ٢٠ - فَقَدْ نَطَقَ الوَحْيُ المُبِينُ بِفَضْلِهِمْ | وَفِي الفَتْحِ آيٌ للصَّحَابَةِ تَمْدَحُ



له وەحیدا دەربارەی فەزڵی هاوەڵان بە ڕوونی باسکراوە

وە لە سورەتی الفتح کە بە ئایەت مەدحی هاوەڵان کراوە



لە سورەتی فتح دا کە لە دوای بەیعەتی رضوان دابەزی لەصولْحی حودەیبیە بە شێوەیەکی ڕوون باس لە صحابەکان دەکات، وە مەدحیان دەکات، کە الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ﴾ [الفتح : ١٠] .

وە دەفەرموێت : ﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ﴾ [الفتح : ٤] .

وە دەفەرموێت : ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ . . .﴾ [الفتح : ٢٩] .

## ٢١ - وَبِالقَدَرِ المَقْدُورِ أَيقِنْ فَإِنَّهُ | دِعَامَةُ عِقْدِ الدِّينِ وَالدِّينُ أَفْيَحُ



وه بەو قەدەری تەقدیر كراوە یەقینت هەبێ چونكە پایەیەكی بەستنی دینە و دینیش فراوانترە .



لێرەدا عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ڕوون دەكاتەوە لەسەر باوەڕبوون بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە، چونكە گرووپە گومڕاكان وەك قەدەریەكان باوەڕیان بە قەدەر نیە، شتەكان دەگەڕێنەوە بۆ بەندە خودی خۆیی هەركارێك كە دەیكات .

## ٢٢ - وَلَا تُنْكِرَنْ جَهْلًا نَكِيرًا وَمُنْكَرًا | وَلَا الحَوضَ والمِيزَانَ إِنَّكَ تُنْصَحُ



وە بە نەزانیەوە ئینکاری منکر و نکیر مەکە

وە - ئینکاری - حەوز و تەرازوو مەکە، ئەمە ئامۆژگاریە بۆت .



لێرەدا تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ جێگیر دەکات، کە هەردوو فریشتە (منکر و نکیر) دێنە لای بەندە و پرسیاری لێدەکەن دەربارەی پەروەردگاری کە کێیە، وە پێغەمبەری کە کێیە، وە دینی .

هەروەها جێگیری بوونی حەوز و تەرازوو دەکات، کە پێغەمبەر ﷺ حەوزی هەیە و مسوڵمانان لەسەری دەخۆنەوە، وە جێگیرکردنی تەرازوو کە دوو تای هەیە، هەموو چاکە و خراپەیەک دەکێشێت .

**٢٣ -** وَقُلْ يُخْرِجُ اللهُ العَظِيمُ بِفَضْلِهِ
مِنَ النَّارِ أَجْسَادًا مِنَ الفَحْمِ تُطْرَحُ

**٢٤ -** عَلَى النَّهْرِ فِي الفِرْدَوسِ تَحْيَا بِمَائِهِ
كَحَبِّ حَمِيلِ السَّيلِ إِذْ جَاءَ يَطْفَحُ



وه بڵێ كه وا الله تعالى بەفەزڵی خۆی

كەسانێ لە ئاگر دەهێنێتە دەرەوە لەكاتێ كە جەستەیان - گۆشتیان - ببووە خەڵوز دەخرێنە

سەر ڕووبارەكان لە فیردەوسدا بۆ هەمیشە دەژین بەو ئاوە - كە پێی دەڵێن ئاوی ژیان -

وەك دانەوێڵە لەو لاوازیەوە دەگەشێنەوە و تازە دەبنەوە



تەنیا كافر بۆ هەمیشە لە دۆزەخ دەمێنێتەوە و ناهێنرێتە دەرەوە لێی .

## ٢٥ - وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ لِلْخَلْقِ شَافِعٌ | وَقُلْ فِي عَذَابِ القَبْرِ حَقٌّ مُوَضَّحُ



وه رسول الله ﷺ بۆ ئینسانەکان تکاکارە

وە بڵێ کەوا سزای ناو گۆڕ حەقە و ڕوونکراوەتەوە



◌ رسول الله ﷺ شەفاعەتکارە بۆ مسوڵمانان، هەرگیز کافران ناگرێتەوە

.

وە شەفاعەت بۆ تاوانی گەورەش دەکرێت بە ویستی الله تعالى .

## ٢٦ - وَلَاتُكْفِرَنْ أَهْلَ الصَّلَاةِ وَإِنْ عَصَوْا | فَكُلُّهُمُ يَعْصِي وَذُو العَرْشِ يَصْفَحُ



وە ئەهلی نوێژ تەکفیر مەکەن ئەگەرچی تاوانباریش بن

هەموو کەس خاوەنی تاوانە وە الله کە خاوەنی عەرشە لێخۆشبووە



وەک ڕەددێ بۆ خەواریجەکان کە خەڵک بەتاوانی گەورە تەکفیر دەکەن .

هەروەها جێگیری عەرش دەکات کە دەبێت ئیمانمان پێی هەبێت، وە عەرش یەکێکە لە درووستکراوە گەورەکانی الله تعالی .

## ٢٧ - وَلَا تَعْتَقِدْ رَأْيَ الخَوَارِجِ إِنَّهُ | مَقَالٌ لِمَنْ يَهْوَاهُ يُرْدِي وَيَفْضَحُ





وه باوەڕت بە ڕەئی خەواریج نەبێت

کە بەڕاستی قسەکانیان بۆ ئەوانەیە کە شوێنی ئارەزووەکانیان

دەکەون و تیادەچن وە ئاشکرایە - بیدعەکەیان - .



خەواریجەکان ئەوانەن کە بەتاوانی بچووک خەڵک تەکفیر دەکەن، وە زیادەڕۆیی لەدیندا دەکەن، هەروەها قسەکانیان بەپێی ئارەزووەکانیانە نەک بەوەی اللہ بیەوێت، ئەمانە گومڕان و دوورن لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە، وە ناتوانن بیدعەکەیان بشارنەوە .

## ٢٨ - وَلَاتَكُ مُرْجِيًّا لَعُوبًا بِدِينِهِ | فَإِنَّمَا المُرْجِيُّ بِالدِّينِ يَمْزَحُ



وە مورڕجیئە مەبە کە یاری بە دینەکەی دەکات

چونکە بەڕاستی مورڕجیئەکان گاڵتە بە دینیان کرد



مورڕجیئەکان کە پێچەوانەی خەواریجەکانن، وە کاتێ دەڵێت گاڵتە بە دینیان دەکەن چونکە ئەوان پێیان وایە کە هەرکەسێ مادام ئیماندارە ئەگەر نوێژ و ڕۆژوو نەکات، وە دوورنەکەوێتەوە لە حەرام، وە هیچ کردەوەیەک ئەنجام نەدات ئەوا هەر ئیماندارە .

ئەم عەقیدەیە جگە لە گاڵتە پێکردن شتێکی تر نییە، چونکە تەنیا یاری بە دین دەکەن .

## ٢٩ - وَقُلْ : إِنَّمَا الإِيمَانُ قَولٌ وَنِيَّةٌ | وَفِعْلٌ عَلَى قَولِ النَّبِيِّ مُصَرَّحُ |



وه بڵێ كه ئیمان وته و نیه‌ته

وه كرده‌وه‌یه، له‌سه‌ر فه‌رمایشتی رسول الله ﷺ كه به صحیحی هاتووه - كه ئیمان قه‌ول و نیه‌ت و كرده‌وه‌یه - .

# ٣٠ - وَيَنْقُصُ طَوراً بِالمَعَاصِي وَتَارَةً | بِطَاعَتِهِ يَنْمِي وَفِي الوَزْنِ يَرْجَحُ



ئیمان کەم دەکات بە تاوان و سەرپێچی کردن، وە زیادیش دەکات بە گوێڕایەڵی کردنی الله تعالی

وە تەرازووی ئینسانی پێ قورس دەبێت، کە ئەوەش بەڕوونی هاتووە



ئیمان لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە زیاد و کەم دەکات، وە الله تعالی بەڕوونی باسی کردووە دەفەرموێت : (وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا) [**الأنفال** - ٢] .

(أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَانًا) [**التوبة** - ١٢٤]

(زَادَهُمْ هُدًى) [**محمد** ـ ١٧] .

ئیمان بە تاوان کەم دەبێ، وە بە عیبادەت زیاد دەبێ .

## ٣١ - وَدَعْ عَنْكَ آرَاءَ الرِّجالِ وَقَولَهُمْ | فَقَولُ رَسُولِ اللهِ أَزْكَى وَأَشْرَحُ



وه وازبێنه لەبیروڕای ئەوانەی کە بەپێی بیروبۆچوونی خۆیان قسە دەکەن،

چونکە بەڕاستی ووتەی رسول الله ﷺ بۆ ئێمە باشتر و ڕوونترە

## ٣٢ - وَلَا تَكُ مِنْ قَومٍ تَلَهَّوْا بِدِينِهِمْ | فَتَطْعَنَ فِي أَهْلِ الحَدَيثِ وَتَقْدَحُ



وه لەو کەسانە مەبە گاڵتە بە دینەکەی خۆیان دەکەن

وه لەو کەسانە مەبە کە قسە و ڕەخنە لە ئەهلی حەدیث دەدەن و ناشرینیان دەکەن - وە قسەیان پێ دەڵێن - .

# ٣٣ - إِذَا مَا اعْتَقَدتَّ الدَّهْرَ يَا صَاحِ هَذِهِ | فَأَنْتَ عَلَى خَيرٍ تَبِيتُ وَتُصبِحُ



ئەگەرهاتوو باوەڕت بە هەموو ئەوانە هەبوو کە لەو قەصیدەیەدا باسم کرد

ئەوا تۆ لەسەر خێریت لە ئێوارە و بەیانیاندا



مەبەستی ئەوەیە کە بەردەوام بە لەسەر ئەو عەقیدەیە، بەڵام ئەگەر هاتووە ماوەیەک لەسەر ئەو عەقیدەیە بوویت و پاشان وازت لێهێنا ئەوە هیچ سودێکت پێناگەیەنێت، هەتاوەکو دەمریت لەسەریبە، ئەگەر وانەبێت باوەڕت پێی هەبێت سەرەتا پاشان بگەڕێیتەوە سەر گومڕایی ئەوا دەبیتە یەکێک لەوانەی کە بە هیلاک چوون و گومڕابوون، بەڵام ئەگەر هاتوو کاربکەیت بەوەی کە باسم کردووە لەو قصیدەیە لەو بەیتانەدا ئەوا بەڕاستی دەستت گرتووە بەشتێک و ڕێگایەکی زۆر ڕاست، وە هەرکەس پێچەوانەی بکات ئەوا یەکێکە لەوانەی کە پێچەوانەکارە.

کاتێک کە ئیمام دەڵێت : دەستت بەو شتانەوە بگرن کە لەو مەنظومەیە باسم کردووە مەبەستی ئەوە نییە کە لەبەر ئەوەی هی ئەوە، نەخێر، بەڵکو لەبەر ئەوەیە هەرچی لەناو ئەو مەنظومەیە دایە لە قورئان و سوننەت وەریگرتووە نەک بۆ مەدحی مەنظومەکەی بێت .

لەو کەسانە مەبە کە بەیانی دەکەنەوە بە ئیمانداری و ئێوارەیان لێدێت کافردەبنەوە،

یاخود بە پێچەوانەوە، بەهۆی ئەو فیتنانەی کە توشیان دەبێت .

لەوانە مەبە چونکە تۆ لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعەیت کەئەمەش فیرقەی ناجیەیە - کۆمەڵەی ڕزگاربوو - .

وە فیرقەی ناجیە رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (ئومەتەکەم جیادەبنەوە بۆ (٧٣) کۆمەڵ، هەموویان لە ئاگری دۆزەخەدان ئیللا یەک کۆمەڵەیان نەبێت، ئەو کۆمەڵەیەیی کە ڕزگاربوو) . (**رواه ابن ماجه ٣٩٩٢**) .

ناوی لێنراوە کۆمەڵەی (ڕزگاربوو)، چونکە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت .

وە هەروەها ناویان لێنراوە ئەهلی سوننە، چونکە کاردەکەن بە سوننەتی رسول الله ﷺ وە بە قەولی رسول الله ﷺ .

وه پێیان دەوترێ (جەماعە) لەبەرئەوەی کۆکن لەسەر بابەتەکان و جیاواز نین .

تمَّتْ بحمدِ اللهِ

https://t.me/KitabSalaff